هەرێمی کوردستانی عیراق

وەزارەتی پەروەردە

# یارییە بچوکەکان

## بۆ پەیمانگەکانی مامۆستایان

### بەشی پەروەردەی وەرزشی

### قوناغی یەکەم



هەرێمی کوردستانی عیراق

وەزارەتی پەروەردە

# یارییە بچوکەکان

بۆ پەیمانگەکانی مامۆستایان

بەشی پەروەردەی وەرزشی

قوناغی یەکەم


ئامادە کردنی

محسن محمد غریب

سەرپەرشتیاری پەروەردەی

وەرزشی



چاپی یەکەم ٢٧٠٢ کوردی ٢٠٠٣ زایینی - ١٤٢٣ کۆچی

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە - هەولێر

# به ناوی خوای گەورە و میهرەبان

(پێشەکی)

پەروەردەی وەرزشی رۆڵێکی گرنگی هەیە لەم رۆژگارەدا لە ژیانی گەلان دا بە گشتی، چونکە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە ژیانی ڕۆژانە بە شێوەیەك بۆتە هۆکارێك بۆ ئامادە کردنی هاووڵاتی بەهێز و بەختیار تا ببێتە ئەندامێکی بە سوود و بە پەروەردەیەکی جەستەیی و دەروونی دروست و زانستانە پێبگەیەنرێت.

وەیارییە بچووکەکانیش بەشێکی گرنگە لە چالاکی قوتابخانەکان کەوا لە میانەی یارییە وەرزشیەکان ئەنجام دەدرێت لە وانەکانی پەروەردەی وەرزشی کە لە بنەما سەرەکیەکانی پرۆگرامی پەروەردەی وەرزشی دەژمێردرێت بە تایبەتی لە قوناغی سەرەتایی، ولە رێگای ئەم یاریيانە منداڵان فێری بنەما سەرەکیەکان و کارامەییە جولەییەکان دەبن وەکو بنچینەیەك بۆ کارامەیی و یارییەکانی سەرەکی .

بۆیە ئێمەش لەم روانگەوەو بە خۆشحالیەوە لەسەر داواکاری وەزارەتی پەروەردە ئەم زانیارییە سەرەتاییانە دەخەینە بەردەستی قوتابیانی خۆشەویستمان لە پەیمانگای مامۆستایان تا لە ژیانی مامۆستایەتی وەکو سەرچاوەیەك بە کاری بهێنین ........ و لە کۆتایی، داوای لێ بووردن دەکەین لە رووی رێزمانی زمانەوانی .... لەگەڵ رێزو سوپاسم دا.

# ناوەرۆك

## قۆناغی یەكەم/ المرحلة الاولی

ا- بەهای لەش (جەستەیی) (القیمه البدنیه)

ب - بەهای حەسانەوە. (القیمه الترویحیه)

ج - بەهای رەوشتی . (القیمه الخلقیه)

د - بەهای کۆمەلأیەتی . (القیمه الاجتماعیه)

ه - بەهای هزروبیر . (ا لقیمه العقلیه )

و - بەهای تەندروستی. (القیمه الصحیه )

٩- بنچینەکانی هەلّبژاردنی یارییە بچووکەکان.

(اءسس اختیار الالعاب الصغیره)

١٠- جۆرەکانی یارییە بچووکەکان. (انواع الالعاب الصغیره)

١١- داوا کردن لە هەر قوتابیەك بە نووسینی (٣٠) یاری بچووك.

(تكليف كل طالب بكتابة (٣٠) لعبة صغيرة)

# چەمکەکانی گشتی یارییە بچووکەکان

(المفاهیم العامە لألعاب الصغیر)

یارییە بچووکەکان بەشێك بوون لە کۆمەڵگای کۆن کە ناسراو بوو بە مێژووی مرۆڤ کە نموونەیی وەهەلسەنگاندنی ئەم کۆمەلگایەی دەنواند. ئەم یارییانە رۆلێکی زیندوو دەبینێن لە گەشە کردن وپێشکەوتنی منالآن کە تا ئێستاش هەڵدەستی بەو ئەرکە زیندووە.

ژیان فێربوون و گەشە کردنە وئێمە فێردەبین کە قسەبکەین یا بخوێنیەوە یا تۆپین بکەین ویا لەگەڵ هاوڕێ کانی هاوتەمەنی خۆمان بڕۆین. ولە شتە هەرە گرنگەکانی فێرکردن کە رووبەرووی ئەو تازە پێگەیشتوانە دەبێتەوە لە تەمەنە جیاوازەکاندا کە دەبێ دابین بکرێ وەکو منالْ بۆی هەبێ پێ بگاو پێش کەوێ وبە باشترین شێوە وەکو ئەوەی خوارەوە :-

١- فێرکردنی توانای جەستەیی پێویست بۆ بەشدار بوونی سەرکەوتوویی لە یاریە ئاساییەکان و لەوانەی کە منالْ ئەنجامی دەدا لەداهاتوو وئەم توانایی یانەش ئەوانە دەگریتەوە/— هێز— پشوودرێژی— هاوسەنگی - دەرکەوتن - کات دانان - سووکی - جوانی - خێرایی - هاویشتن - بازدان .

٢- رێ کردنی قوتابی بۆ هاورێکانی لە هاو تەمەن بۆ خۆ گونجاندن وپێش کەوتنی کۆمەلآیەتی .

٣- پێك هێنانی بیرێکی پێگەیشتوانە لە خۆوەوبە پێك هێنانی هەست کردن بەرازی بوون (القناعە).

٤ـ ناسینی پایەی كۆمەڵایەتی كەسان لەلایەن ڕەگەزییەوە وهەڵس وكەوت كردن لەسەر ئەم بنەمایە.

٥ ـ پێك هێنانی سەرەتاكان لە رێگای پێش خستنی رەوشتی چاك و رێزگرتن لە یاساكان.

٦ ـ فێربوونی هاوبەشی لە بەكارهێنانی كەل وپەلی وەرزشی وەرێ نەدان بە خەڵكانی‌تر بۆ بەكارهێنانی و رێزگرتن لە مافەكانی خەڵكی تر.

٧ ـ پێدانی هەڵ بە قوتابی و ئاگادار كردنی كەیاری ووەرزش دانراوە لە لایەن زانایانی دەروون كە ئەمەش شتێكی سروشتی‌یە.

٨ ـ ئامادە كردنی زانیاری لەو یارییانە كە لە دەرەوەی قوتابخانە بەكار دەهێنرێ .

<u>تایبەتمەندیەكانی یارییە بچووكەكان</u> :ـ (خصائص الالعاب الصغیره)

١ـ تایبەت دەبێ ئەم یاری‌یە بە دەركەوتنی سەركەوتوو وسەر كەوتوو بەسەرا، بە شێوەیەكی یەك كەرەوە كە ئەم شتە پسپۆریەكی بە سوودی لێ دەردەچێ.

٢ـ چالاكی بیری ودەروونی وگیانی بەرزی دەوێ وپێویستی بە پلەیەك راهێنان وسەرنج دان وئاگادار كردنەوەهەیە.

٣ـ بە خۆنیشان دانێكی شارستانی دادەنرێ چونكە یارییەكانی كۆمەڵگای كۆن دەژییێنتەوە وبەشداری دەكا لە زیندوو كردنەوەی كەلەپوور.

٤ـ وەرزش شتێكی خۆویستی‌یە كەئەو كەسە بەویستی خۆی وبەبێ زور لێ كردن وناخۆشێ ئەنجامی دەدات .

**ياريیە بچووكەكان چین**: - (ماهی الالعاب الصغیره)

پێناسەی ياريیەكانی بچووك: (تعريف الالعاب الصغيره) :- كۆمەلە ياريیەكی هەمە لايەنە ياريزانێ يان زۆر ترئەنجامی دەدات ودابەش دەكرێ بۆ كۆمەلەكانی لەيەك چوو هەر كۆمەلێك جياوازە لەوەی تر بەگوێرەی ئەو كارتێ كردنە پەروەردەيی وفێركردنە وبە گوێرەی سروشتی چالاكی . وەهەروەها ناوبراوە بەم ناوە چونكە ئاسانە لە لايەن بنچينە وياساكاندا وئەو مەرجانەی بۆی دانراوە.

**مەبەستەكانی ياريیە بچووكەكان** :- (اغراض الالعاب الصغيره)

ياريیە بچووكەكان چالاكی‌يەكی ئەنجام دەرە بۆ هەموو ئاستەكان ودەبێ مەبەستەكانی روون بكرێتەوە وەكو هەموو چالاكی‌يەكانی تر ئەوانەی ئەنجام دەدرێن لە بواری پەروەردەی وەرزشی ومەبەستەكانی ئەم ياريیە بچووكانە لەم چوارچێوەدا دەبێ : -

١- **گەشە كردنی جەستەيی** : - ئەم مەبەستە گرنگی دەدا بە پرۆگرامەكانی جوولانەوە كەهێزی لەش پەيدا دەكات بۆمرۆڤ لەرێگای بەهێزكردنی ئامێری ماسولكەی جۆراوجۆر بۆ لەش .

٢- **گەشە كردنی جولەيی** :- جولەكانی لەش بەكەلك دەكات لەگەلْ ئەنجام دانی رادەيەكی كەم لەوزەو والە مرۆڤ دەكات بە توانا بێ وجولانەوەكانی جوان ورێك وپێك دەكات .

٣- **گەشە پێدانی‌بيری** :- گەشە پێدانی‌بيری و كۆ كردنەوەی شتەكانی ناسياو وبايەخدان بە توانای بيركردنەوە وشی كردنەوەی ئەو ناسياوانە بە شێوەيەك ئەم جولە هەمە جۆرانە سەركەوتوانە ئەنجام بدرێن.

- گەشە پێدانی پەیوەندییەکانی مرۆڤایەتی:- کرداری خۆگونجانی کەسی وکۆمەڵ ویارمەتی مرۆڤ تاوەکو ببێتە ئەندامێکی بەکەڵک لەناو کۆمەڵگادا.

٥- گەشە کردنی تەندروستی جەستەیی ودەروونی وبیری:- چالاکی وەرزشی وئەنجام دانی یارییە بچووکەکان رەگەزێکی گرنگە لە رەگەزەکانی پاراستن (الحصانه) بۆ زیاد کردنی توانایی جەستە بۆ بەرگری کردن لە تووش بوونی هەندێ نەخۆشی.

**گرنگی یارییە بچووکەکان** :- (اهمیه الالعاب الصغیره) یارییە بچووکەکان لە بالاترین شێوەکانی پەروەردەیی وەرزشی دەژمێردرێ وجێگایەکی پێش چاو داگیر دەکا لە نێوان یاری وچالاکی وەرزشی هەمەرەنگ وجۆراو جۆرەکان . وەبەشێکی گەورە لەمیانەی چالاکی وەرزشی پێک دێنی بە تایبەتی لەوانەکانی پەروەردەی وەرزشی.

٤- **خاسیەتەکانی یارییە بچووکەکان**:- (ممیزات الالعاب الصغیره) ئەم یارییە بچووکانە وەکو بەهایەکی پەروەردەیی جیا دەکرێتەوەو رێ خۆش کەرن بۆ پەروەردە کردنی خوورەوشتی بەرز. وەبوارە جۆراو جۆرەکانی یارییە بچووکەکان بەشداری دەکەن لەگەشانەوەی خاسیەتەکانی هەرەوەزی وپشت گرتن وبرایەتی ورێکخستن وملکەچی وداوێن پاکی وپشت بە خۆبەستن و تێکۆشان بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن وئازایەتیە .

٥- **بەکار هێنانەکانی یارییە بچووکەکان لەوانەکانی پەروەردەی وەرزشیدا**:- (استعمالات الالعاب الصغیره فی دروس التربیه الریاضیة)

١- پێشەکی/ پێک دێ لە راهێنانەکانی گەرم کردن.

٢- ئـەم يارييانـــە لـــە جيـــاتی ڕاهێنانـــەكانی جەســـتەیی وشـــێوەیی بەكاردەهێنرێت تاهەمان ویست وئامانج دابین بكات.

٣- دەبێ ئەم یارییانە یەكێك بن لـە هۆیـەكانی ڕاهێنـان بـۆ پێش خستنی مرۆڤ لە ڕووی دەرونی وجولەیی وبیری كۆمەڵایەتی .

**یارییە بچووكەكان لە كاروباری دەرەكییەكان دا : (اللاصفیە ):-**

(الالعاب الصغيره فى اعمال اللاصفيه)

ئەم یارییانـە دەتوانـرێ ئـەنجام بـدرێ لـە نـاو قوتابخانـەكان وەكـو چالاكی‌یەكی دەرەوەی پۆل بە تایبەتی یارییە میللی یـەكان. ئەگـەر هـاتوو هەموو پێویستیەكی مادی بۆ دابین كرا. وەكو گۆرەپان ویاریگا وئـامێر لـە لایـەك و هـەبوونی كـاتێكی شیاو بـۆ ئـەنجام دانـی لەلایـەكی تـرەوە. بـە تایبـەتی لـەو پشووانەی دەكەونـە نێـوان وانەكانـە دوای نیـوەڕۆ. چونكـە یـاری هۆیەكـە بـۆ گێرانـەوەی چـالاكی قوتـابی. وەئێمـە دەتوانـین ئـەم یای‌ییانە ئەنجام بدەین بە، بەكار هێنانی لە ڕاهێنانە وەرزشـی‌یەكان وەكو چالاكی‌یـەكی دەرەوەی پـۆل كـە مامۆسـتا جێبـەجێی دەكـات بـەگوێرەی برگەكانی پرۆگرامی چالاكی‌یە وەرزشی‌یەكانی قوتابخانە.

**یارییە بچووكەكان لە نێوان كۆمەلگادا: -(الالعاب الصغيره فى المجتمع )**

ئەم یارییـە بچووكانـە بـە تایبـەتی یارییـە میللی یـەكان كاریگەریـەكی قولیـان لەسـەرمرۆڤ و كۆمـەلدا هەیـە كـە ئـەنجام دانـی دەبێتـە هـۆی بـە دەست هێنانی‌هێزو چوست وچالاكی گیانی.

وەئەم یاریانە دەتوانرێ بەكا ر بهێنرێ لەم بوارانەی خوارەوە :-

١- خێوەتگای قوتابیان .

٢- چالاكی‌یە كۆمـەلایەتیەكان وەكو ئاهەنگ گێران.

ت- گەشت وسەیران:

- کەنارو گەرماوەکانی مەلەوانی

بەهاکانی یاری:- (قیم اللعب) یاری شێوەیەکە لە شێوەکانی چالاکی مرۆڤ وشێوازێکی سروشتییە وپێداویستێکی بنەرەتیە کەپالی پێوە دەنێ بۆ نیشن وجولان وچالاکی کە چێژو ئارام بوون دابین دەکات .

وە یاری راهێنانی سروشتییە بۆهێزە هەمە رەنگەکانی مرۆڤ و رێگایەکە بۆ گەشە کردنی ئەم هێزانە وئەوانەش تەنیا بۆ منالآن ناگونجێ بەڵکو بۆ گەورەکانی هەردوو رەگەز دەگونجێ.

وە دەتوانرێ بەهای ئەم یارییە بچووکانە دەست نیشان بکرێن بەمانەی خوارەوە:

ا- بەهای جەستەیی:- (القیمە البدنیە) ئەنجام دانی ئەم یارییە بچووکانە هۆیەکە بۆ دەست کەوتنی توانای جەستەیی لای مرۆڤ وهێز پێدان وجوانی لەش وخێرایی‌و نەرمی نواندن ودەست کەوتی بەرگری تەندروستی. وەهەروەها ئەنجام دانی ئەم یارییانە کار دەکەنە سەرهەستەکان و دەمارەکان وماسولکەکان و دەتوانرێ کاری ئەم وەرزشە جیا بکرێتەولە بەدی هێنانی تەندروستی گیانی لەمانەی خوارەوە:

أ- یاریدەدەرە بۆ گەشەپێدانی جەستەیی بەشێوەیەکی سروشتی دروست لە تەمەنە جیاجیاکاندا.

ب - گەشە پێدانی‌هاوتایی ماسولکە ودەمار.

ج - یاریدەدەرە بۆ بەهێزکردنی ماسولکە وئامێرە جۆراو جۆرەکانی لەش.

د - گەشە بەوزەی ئۆرگانی ئەدات .

ه - توانای جولانەوەی بێ پایان وزیرەکی بەرز بە مرۆڤ دەبەخشێت.

و- گەشە بە توانای مرۆڤ دەدا لەبەرگری کردن لە خۆ.

**٢- بەهای حەسانەوە:** ـ (القیمه الترویحیه)
ئەنجام دانی ئەم یارییە بچووکانە مرۆڤ لەشوم وبێزاری دوور دەکاتەوەو گرژی لە گیانی مرۆڤ وتێك هەلچوون دوور دەخاتەوەو خۆشی وشادی دەخاتە دەروونیەوە.
**٣- بەهای رەوشتی :** - (القیمه الخلقیه) دەتوانین هۆکارەکانی ئەنجام دانی ئەم یارییە بچووکانە بۆ دابین کردنی بەهاکانی رەوشتی بەمانەی خوارەودابنێین.
أ - ئەم یارییە گیانێکی وەرزشی بەرز دروست دەکات لەرێزگرتنی یاساو دەست پاکی وئازایەتی و رابەرایەتی .
ب - جێگیرکردنی بەهاکانی شێوازی رەوشتی باش لەرێگای دووبارە کردنەوە تاوەکو دەبێتە راهاتێکی پێوەلکاو بۆی وببێتە بەشێك لە رەوشت وهەلس وکەوتی لە ژیانی تایبەتی وگشتی.
ج - گەشەپێدانی توانایی لەسەر کۆنترل کردن لەسەرگیانی خۆنەویستی وگۆرینی بۆ بەرژەوەندی گشتی .
د - گەشە پێدانی‌لایەنە کۆمەلایەتیەکان. چونکە زۆر لەم یارییانە پێویست دەکات بەهاوکاری کۆمەل ولایەن گیری وهەست کردن بە کۆمەل.
**٤- بەهای کۆمەلایەتی/-** (القیمه الاجتماعیه) ئەم یارییە بەشداری دەکات بە بەشداری‌یەکی پتەو لەبەهێزکردنی پەیوەندییەکانی کۆمەلایەتی بۆ مرۆڤ چونکە یارمەتیان دەدا لەگەشە پێدانی شێوازی هەست کردن بە جیاوازی کۆمەلایەتی.
**٥- بەهای هزرو بیر:-** (القیمه العقلیه) ئەم یاری‌یانە بەرێگایەکی راست دادەنرێت بۆ چالاکی گیانی وهزری وهۆشمەندی، ئەم جیاکەرەوەیە دەبێتە هۆی بەردەوام بوونی ژیانی داهاتوو.
**٦- بەهای تەندروستی :-** (القیمه الصحیه) ئەنجام دانی ئەم یارییە بچووکانە یەکێکە لە هۆیە گرنگەکانی کە ئامانجەکانی خۆپاراستن

ـەیێتەدای چونکە کار دەکا بۆ گەشە پێدانی هۆشیاری و زانیاری پێدانی تەندروستی ساغ و یارمەتی دەدا لەسەرگەشە پێدانی لاریبیەکان وپاراستنەکانی هاندەری تەندروستی.

بنەماکانی هەڵبژاردنی یارییە بچووکەکان :- (اوسس اختيار الالعاب الصغيرة)

مرۆڤ بە قۆناغەکانی جۆراوجۆر تێ دەپەرێ ولە هەر قۆناغێك دا جیاکەرەوە وتایبەتمەندی وپێویستیەکانی لەوەی تر جیا دەکاتەوە ولەسەر مامۆستای یارییەکان پێویستە کاربکات لەگەڵ منالان وتازە پێگەیشتووان ولاوان تا وەکو ئەم شتانەی باسمان کرد باش وەری بگرن و بۆ ئەوەی باش هەڵبژاردنی ئەم یارییانە دابین بکا و بۆ دارێژتنی بەرنامەکان بەپێی ئەوەی بۆی دانراوە چونکە هۆیەکە بۆدابەش کردنی خاسیەتەکانی پەروەردە وفێرکردن.

وەهەندێ خالی گرنگ هەن کە دەبێ لەسەر شارەزای وەرزشی پەیرەوی یان بکات لەکاتی هەڵبژاردنی ئەم یاریانە.

وە دەتوانین ئەم خالانە بەم شێوەی خوارەوکورت بکەینەوە :-

أ - ئامانجی پەروەردە وفێرکردن.

ب - قۆناغی گەشە پێدان کەپێدا دەروات.

ج - جیاوازی یەکانی ڕەگەزی.

د - تایبەتمەندەکانی جیاکەرەوە بۆ پۆلی خوێندن.

ه - سروشتی جیاکەرەوبۆ وانەکانی پەروەردەی وەرزشی.

و – شوێنی یاری کردن.

**جۆرەکانی یارییە بچووکەکان:** ـ (انواع الالعاب الصغیرە) ئەم یارییە بچووکانە زۆرن وهەمە جۆرن و لەهەموو نووسراوە گرنگەکان رێك کەوتون وەدەست نیشانیان کردووە بە مانەی خوارەوە :-

**یەکەم:-** ئەم یارییە جیا دەکرێتەوە لەیاری‌یەکانی‌تر چونکە پێویست بە توانای جەستەیی زۆر ناکا بۆ ئەنجام دانی ولە گۆرەپانێکی بچووك لە زەوی ئاسایی ئەنجام دەدرێت.

**دووەم:-** یارییە جوولێنەرەکان(العاب حرکیە): ـ وەکو یارییەکانی راکردن، بەدوای یەکتر کەوتن(المطاردە)کە قوتابیان بە ئارەزوو وسۆزەوە وەری دەگرن.

**سێیەم :-** یارییە ئاسان رێك خستەکان: ـ پێك دێ لە هۆشیاری سەرەتایی وەکو هاویشتنی (ساپ) ئەم یارییە بەوە جیا دەکرێتەوە کە پێویستی تەنیا بە ئامێری سادە وگۆرەپانی بچووك هەیە.

**چوارەم/:** ـ یاریەکانی بە تۆپ ـ ئەم یارییانە شوێنێکی گرنگ لە نێو کۆمەلە یارییە بچووکەکانی هەمەرەنگ داگیر دەکەن جگە لەوەی جیا دەکرێتەو بەهەندێ سوودی گرنگی جیاکەرەوە.

**پێنجەم :-** یارییە میللی یەکان ـ مەبەست لەم یاریانە ئەمانەن کە منالأن لەشەقام وشوێنە گشتی‌یەکان و لەگوندەکان ئەنجامی دەدەن و دەتوانرێ دابەش بکرێ بۆ دووجۆر:-

أ - یاری میللی یەکان کە هەلقولاون لە ژینگەی ناوخۆ وپێش کەوتوونیە.

ب - یارییە میللی یەکانی پێش کەوتووەکان/ـ دوای ئەوەی کە هەندێ گۆرانکاری راست کردنەوە لە ناوەکان ویاساکانیان ومەرجەکانیان کرا وەتاکو بگونجێت لەگەلْ وانەکانی پەروەردەی وەرزشی لە میانی قوتابخانە.

سێیەم: - یارییەکانی رێخۆش کەرو ئامادەیی /- ئەم جۆرە یاریانە جیا دەکرێتەوەو بەزۆری یاساکانیان ودیاری جۆرەکانیان وەک یارییە وەرزشییە گەورەکان دەچن لەمیانی پێ هاتووی جوڵانەوەو پلانەکان وبنچینەکانی یاری.

## هەندێك نموونە لە یارییە بچووكەكان :

### (١) یاری گۆڕینی جێگا بەڕاكردن

(لەوەرزی ڕۆژی خۆش دا)

ژمارەی قوتابییەكان ٢٠ ـ ٤٠

قوتابییەكان لەوێنەی بازنەیی‌دا رادەوەستن و، لەنێوان هەریەكێكیاندا دەبێت ماوەی هەنگاوێك هەبێت ورووویان لەیەكتری بێت مامۆستا یەكێك لە قوتابییەكان، دەهێنێتە دەرەوە ـ ئینجا دەست دەكات بەیارییەكە. قوتابییەكەی دەرەوبەدەوری هاورێكانیدا ڕادەكات و دەسورێتەوە بە خێرایی دەست دەدات لە یەكێكیان بە ئارەزوی خۆی، پاشان رادەكات وقوتابی لێدراو بە شوێنیدا ڕادەكات، ئەگەر گیرا جێگای‌لێدراوەكە دەگرێتەوە وئەگەرنەگیرا- دووبارەی دەكاتەوە، و بەم شێوەیە ئینجا لێدراو بەدەوری بازنەكەدا دەسورێتەوە وڕادەكات ولە هاورێیەكی خۆی دەدات ـ یارییەكە بەو جۆرە ماوەیەك بەردەوام دەبێت وپاشان كۆتایی پێ دەهێنرێت.



## (٢) ((یاری نامەبردن))

(لەوەرزی خۆشدا دەکرێت)

ژمارەی قوتابیەکان ٣٠ ـ ٤٠ قوتابین

قوتابییەکان لەوێنەی بازنەیەکدا رادەوەستن . بەڵام یەکێکیان لەناوەڕاستیاندا ڕادەوەستێت . پاشان مامۆستا ناوی هەریەکەیان بەناوی ژمارەیەکدا وەکو دەنێت بەمەبەستی ژمارەکان یەك لە دوای یەك بێن یان بەناوی شارەکانی ناویان دەنێت .

ئینجا لەپاشان قوتابی ناوەڕاستەوە یاری دەست پێ دەکات بۆ نموونە دەڵێت ، شەمەندەفەر لە بەغداوە رۆیشت بۆ هەولێر ــ لەوکاتەدا ئەو دووقوتابیانەی کە بەناوی ئەو دووشارەوە ناونراون ڕادەکەن بۆ ئەوەی جێگای یەکتری بگرن و هەروەهاش قوتابیەکەی ناوەراستیش خێرا ڕادەکات بۆ ئەوەی کە جێگای یەکێك یان بگرێت لەو سێ قوتابیانە هەرکامیان دواکەوتن ـ ئەوە لەناوڕاستی بازنەکەدا ڕادەوەستێت ویاری یەکە سەرلەنوێ دەست پێ دەکاتەوە بە شێوەی پێشوو .

تێبینی:- لەسەر مامۆستا پێویستە قوتابیەکان بەو جۆرە رابوەستێنێت کە ژمارەکانیان نزیك نەبن لە یەکتری وەکو ژمارە(١) لای ژمارە(٩)رابوەستێت ـ هەروەها بەم شێوەیە .



## (٣) ((یاری گرەو کردنی ریزەکان))

(لەوەرزی زستاندا)

ژمارەی قوتابیەکان لە ٢٠ ـ ٥٠ قوتابین

واباشترە قوتابیەکان بە دوورپیز زیاتر (ریزەکان لە پشت یەکەوە رابوەستن بە پێی ژمارەی قوتابیەکان، یەکەم قوتابی لەهەر ریزێکدا ئالآیەکی بە دەستەوەیە، یان دەستە سرێك، بەدەستیانەوەیە لە پشت هاورێ کانیانەوە رادەکەن کە لەبەر دەمیانەو دەگەرێنەوە بۆ جێگاکانی خۆیان کتوپر کە گەیشتن ئالآکان دەدەن بەو هاورێیانەی کە لە تەنیشتیانەوەن هەروەها هەموو قوتابیەکان بە نۆبە ئەم جۆرە ڕاکردنە دەکەن بە مەرجێك هەموویان لە گەڕانەوەدا بەبەردەمی یەکەمدا بڕۆن ئەو ریزەی زوترو رێك تر یارییەکە تەواو دەکەن لە پێش ئەوانیتردا ئەو تیپەیان براوەیە.



## (٤) «یاری سپی وسور»

بۆهەمو وەرزێک

ژمارەی قوتابیان ٢٠-٤٠

مامۆستا دووهێڵی ڕاست لەسەر زەوی نەخشێ دەکات بە شێوەیەک ناوەی نێوانیان (٢) یارد بێت وقوتابیەکانی دەکات بە دوو تیپی یەکسانەوە یەکێکیان ناودەنێت (سور) و ئەویتریان (سپی) مامۆستا دەتوانێت بە پەڕۆی سور وسپی دوو تیپەکە لە یەکتری جیاواز بکاتەوە پاشان قوتابیەکان لە ناوەڕاستی هەردوو هێڵەکەدا پشتاوپشت بە دوو ڕیز ڕادەوستن لێرەدا یارییەکە دەست پێ دەکات و مامۆستا دەڵێت (سور) لە کاتێکدا کە قوتابیەکان گوێیان لێ بو، بەشی سورەکان رادەکەن بە هێڵەکەی بەرامبەریان هەروەهاش قوتابیانی بەشی (سپی) رادەکەن بە شوێنیانا تا کو دەستیان لێبدەن ئەوانەی دەستیان بەرکەوت دەبێت راوەستن لەجێگای خۆیان دەبن بە(دیل ـ ئەسیر) لە جێگایەکی تایبەتی دادەنیشن پاشان دوو تیپەکە دەگەڕێنەوە بۆ ناوەراست دووبارە مامۆستا ناوی رەنگێکی تر دەڵێت زۆر جار وایە هەمان رەنگی جاری پێشو دەڵێتەوە ومەرج وایە بانگ کردنی رەنگەکان بۆ هەردوو تیپەکە بە قەد یەك بێت بۆ ئەوەی لە کۆتایی یارییەکەدا بزانرێت کام تیپ زۆرتر(دیل ) یان داوە بە دەستەوە بۆ پاداشت وسزا وەرگرتن بە لاسایی دەنگی زیندەوەر یان ووتنەوەی ووتەیەکی نەستەق یا وشتێکی تر وەکو گۆرانی.

## (٤) ((یاری دەستەسڕ بفڕێنەو ڕاکە))

(وەرز هاوینە)

ژمارەی یاریکەران ١٦ تا ٤٠

مامۆستا قوتابیەکان بە دووریزی یەکسانەوە رادەوەستێنێت بە مەرجێك ماوەیان (٤٠)یارد بێت و قوتابیانی هەردوو تیپەکە بە ژمارە ناو دەنێت دەستەسڕێك لەخشتێك نزیك لە ریزێکیانەو لەسەر زەوی دادەنێت لێرەوە یاری دەست پێ دەکات مامۆستا دوو ژمارەی وەکویەك لە هەردوو ریزەکە بانگ دەکات ئەو قوتابیەی کەلە دەستەسڕەکەوە نزیکە خێرا بۆی رادەکات کەهەڵی بگرێت و بگەرێتەوە جێگای خۆی هەروەها دوو قوتابی دووریزەکە رادەکەن بە شوێنیا کە دەستەسڕ فڕێنەکە زووڕای کرد وهاورێکانی نەیان توانی دەستی لێ بدەن .. ئەوا خاڵێك بۆ تیپەکەی دەنوسرێت بەڵام ئەگەر گیراو دەستی بەرکەوت خاڵەکە بۆ تیپەکەی تریان دەنووسرێت هەروەها یاریەکە بەردەوام دەبێت دوودوو لە نێوان قوتابیانی دوو تیپەکەدا لە ئەنجامدا کام تیپ خاڵی زۆرتر گرتبوو ئەوەیان براوەیە.

## (٦)((یاری بەرگدروو وتی))

(وەرز بەهارە )

ژمارەی قوتابیان ١٦ـ ٣٢

قوتابیەکان لەوێنەی نیوبازنەیەکدا رادەوەستن و بۆماوەی (٣٠)یارد بەرامبەری هێڵێکی راست نەخشە دەکرێت پێی دەڵێن (هێڵی گەیاندن، هیوا)(ئامانج )، (هدف)لە ناوەراستی نێوان هێڵەکەو نیوبازنەکەدا کورسی یەك دادەنرێت یەكێك لە قوتابیەکانی لەسەر دادەنیشێت لێرەدا یارییەکەدا دەست پێ دەکات مامۆستا لە قوتابیە دانیشتووی سەرکورسیەکە داوا دەکات و تووێژ بکات بە هەر زمانێك بێت بە مەرجێك لە تەواو بوونی قسەکانیدا پێیان بڵێت (بەرگ درو- ووتی) لە کاتێکدا قوتابیەکان گوێیان لەو ووتەیە بوو بە جارێك خێرا رادەکەن بۆ لای هێڵەراستەکەی (گەیشتن بە هیوا) بەڵام ئەوی سەرکورسیەکە بە شوێنیانا رادەکات ودەستی بەهەر کامیان کەوت پێش گەیشتنیان بە هێڵەکە ئەو جێگای‌دەگرێت ،هەروەها یارینەکە ماوەیەك بەو جۆرە دەروات وکۆتایی پێ دەهێنرێت ، لە قوتابیەکان کامیان نەگیران ئەوەیان دەبێت بەیەکەم.

## (٧) «یاری تارمایی»

(بۆ وەرزەكانی بەهارەو پایز)

ژمارەی قوتابییەكان ١٥ ـ ٤٥

قوتابییەكان بە دوو ریزی یەكسانی بەرامبەر ریز لە یەك رادەوەستن بە دووری (٢٠) پێ و یەكێك لە نێوان هەردوو ریزەكاندا رادەوەستێنێن ئەو ناو دەنێین (تارمایی) ئێرەدا یارییەكە دەست پێ دەكات مامۆستا ناوی قوتابییەك بە ئارەزووی بانگ دەكات لەكام ریز بێت ئەو قوتابییەش لە ریزەكەی تر ناوی قوتابییەكی تر بانگ دەكات وەهەردووكیان رادەكەن كە جێگای یەكتری بگرن هەر لەو كاتەشدا قوتابی ناوەراست (تارمایی)یش رادەكات كەدەست لە یەكێكیان بدات وەدەستی بەر هەركامیان كەوت ئەوەیان جێگاكەی دەگرێت هەروەها یارییەكە چەند جارێك دەكرێت وكۆتایی دێت.



## (٨)((یاری بوەستە ))

(بۆ وەرزی زستان )

ژمارەی قوتابییەکان ـ ١٠ تا ٤٠

قوتابییەکان لە وێنەی بازنەییدا رادەوەستن وماموّستا هەریەکێ بە ناوی ژمارەیەکەوە ناویان دەنێت و یەکێك لە قوتابییەکان رادەوەستێنێت لە ناوەراستی بازنەکەدا کە توپێکی بە دەستەوەبێت لێرەدا یارییەکە دەست پێ دەکات وماموّستا یەکێك لە قوتابییەکان بە ژمارەکەی خۆی بانگ دەکات ئەوەی ناوەراست تۆپەکە هەل دەدات بۆ قوتابی بانگ کراوە کە دەیگرێتەوە کە گرتیەودەلێت (بوەستە) لەم کاتەدا قوتابییەکان بە جارێك لە جێگای خۆیان رادەوەستن وتۆپەکەیان تێدەگرێت بە مەرجێك نابێت خۆیان لێ بدەن ئەگەر بەرهەریەکێکیان کەوت جێگای یەکتری دەگرنەوەو ئەوانەی سێجار هەلە بکەن لە یارییەکە دەردەکرێن وئەوانەی تۆپەکەیان بەردەکەوێت دەچێتە جێگای یەکەم ولە ناوەراستی بازنەکەدا رادەوەستێت بە تۆپەکەوە هەروەها یارییەکە دووبارە دەکرێتەوەچەند جارێك تا کۆتایی دێت.



## (٩) ((یاری بەندە کوێرەکە ))

(بۆ وەرزی هاوینە)

ژمارەی قوتابی ١٠-١٥ دەبن

قوتابیەکان لە وێنەی بازنەدا رادەوەستن و یەکێکیان لە ناوەڕاستیاندا رادەوەستێت. چاوی بەستراوەتەوە وگۆچانێکی بە دەستەوەیە لێرەدا. یارییەکە دەست پێ دەکات کە مامۆستا داوا لەقوتابیەکان دەکات بۆراست ویان بۆ چەپ بسوڕێنەوە بخولێن. ئینجا داوای راوەستانیان لێ دەکات هەروەها لە (بەندە کوێرەکە) داوا دەکات کە بەداردەستەکەی ئیشاری یەکێکیان بکات و فەرمانی ئەدات بەسەریدا لە لاسایی زیندەوەرویان باڵندەیەك (دەنگیان، یان خوێندنیان، یان حیلاندن ؛ یان زیرەیان) لاسایی بکاتەوەبەمەرجێك لە ووتنی لاسایی کردنەوەکەیدا شێوەی دەنگی خۆی بگۆڕێت بۆ ئەوەی (کوێرەکە)نەی ناسێتەوە ئەگەر ناسیەوە جێگاکەی ئەو دەگرێت و ئەگەر نەی دۆزیەوە یارییەکە جارێکی تر دووبارە دەکرێتەوە ماوەیەك یارییەکە دەکرێت وپاشان کۆتایی پێ دەهێنرێت.



## (١٠) (( یاری ژمارە نەزانراو ))

### (بۆ وەرزی هاوینە)

ژمارەی قوتابیان ١٦ تا ٣٤

قوتابییەکان بەدوو ریزی یەکسانی بەرامبەر بەیەك رادەوەستن وماوەیان لەیەکتر(١٠)یارد بێت وقوتابیەکانی هەردوو ریزەکە بە ژمارەی یەك لە دوای یەك ناودەنرێن وەکو (١، ٢، ٣، ٤، ٥) هتد.....

قوتابیەك لەهەر کام ریزیان بێت لە ناوەراستیاندا رادەوەستیت بە مەرجێك مامۆستا هەلی بژاردبێت و توپێکی دەدرێتە دەست لێرەدا یارییەکە دەست پێ دەکات قوتابی ناوەراست بانگی ژمارەی یەکێك لە قوتابیەکان دەکات لە هەر دوو ریزدا، پاشان تۆپەکە بە ئاسماندا هەل دەدات خاوەن ژمارەکە هەول دەدات دەست لە تۆپەکە بدات لەم دوانە کەمیان لە پێش ئەویتریانا دەستی بەر تۆپەکە کەوت ئەویان خالێك بۆ ریزکەی خۆی دەنوسێت ئینجا ئەوەیان کە دەستی بەر تۆپەکە ناکەوێت تۆپەکە هەل دەدات هەروەها یارییەکە بۆ ماوەیەکی تایبەتی درێژە دەکێشێت کام ریزیان زۆرتر خالیان هەبێت یارییەکە دەباتەوە.



## (١١) ((یاری پێش کەوتن لەڕاکردن دا))

(لەهەموو وەرزێکی خۆشدا دەکرێت )

ژمارەی یاریکەرەکان (١٦ - ٦٠)دەبێت

قوتابیەکان لە دووریزیان زیاتر لە پشت یەکەوە رادەوەستن بەم جۆرە (قوتابیەکان لە پشت یەکەوەبن) ویەکی ژمارەیەکیشیان دەدرێتی وەکو(١، ٢، ٣) هتد...... پاشان مامۆستا ژمارەیەك لە هەر ریزیك بانگ دەکات ئەمانەش خێرا رادەکەن بۆ پشت هاورێکانی دواوەیان ئینجا بۆ تەنیشتیان وبۆ بەردەمی یەکەم قوتابی ریزەکان یان لە تەنیشتەکەی تریانەوە بەرە وجێگاکانی خۆیان دەگەرێنەوە لە ئەنجامدا ئەوانەی زووتر بەبێ هەلە کردن دەگەرێنەوە شوێنەکانی خۆیان بۆ تیپەکەی خالێك دەنوسرێت هەروەها مامۆستا ژمارەی قوتابیانی تر بانگ دەکات یەك لە دوای یەك لە ریزەکان بۆ ئەوەی یاریکەرەکان ئاگاداربن ولە کۆتایی یارییەکەدا کام ریز زۆرتر خال وەرگرتبێت ئەوەیان یەکەمی وەردەگرێت.



## (١٢) (( یاری کوێره دەپشکنی ))

(بۆ وەرزی زستانه )

ژمارەی قوتابیان ١٠ تا ٤٠

قوتابیەکان هەموویان له یاریگا بڵاودەبنەوه ماموٚستا چاوی یەکێکیان دەبەستێتەوه لێرەدا یارییەکه دەست پیٚ دەکات ماموٚستا داوا له قوتابیەکان دەکات کەبه ( هەنگەشەلی ) بڕۆن وهەروەها (چاوبەستراو . کوێره) هەول دەدات به شوێنیاندا بگەڕێت . که دەست بدات له یەکێکیان له ئەنجامدا کوێره دەستی بەر هەر قوتابیەك بکەوێت ئەوەیان دەچێته شوێنەکەی و ئەو قوتابیەی قاچ دانی بۆ سەر زەوی دەبێت له جێگای خۆی رابوەستێت ونەجولێت خۆ ئەگەرکوێرەش دەستی بەری کەوت دەچێته شوێنەکەی . هەروەها ئەم یارییه ماوەیەك درێژه دەکێشێت و پاشان کۆتایی پیٚ دەهێنرێت.



## (١٣) ((یاری گرەو کردن بە دوو تۆپ))

(بۆ وەرزی بەهارو پاییز)

ژمارەی قوتابیەکان ١٦ ـ ١٠

مامۆستا قوتابیەکان دەکات بە دوو بەشی یەکسانەوەو سێ هێلی راست بەرامبەر یەکتری کە درێژی هەریەکەیان(١٠) پێ بێت لەسەر زەوی دەکێشێت کەماوەی هێلێك بۆ ئەویتریان (٢) مەتر بێت، هەربەشێك لە قوتابیەکان لەسەر هێلێك رادەوەستن یەك لە پشت یەك وبە مەرجێك هێلی ناوەراست وازلێ بێنرێت ومامۆستا بە هەر تیپە تۆپێکیان دەداتێت بەمەرجێك وەکو یەك بن . لێرەدا یاریەکە دەست پێ دەکات هەر ریزێك لە قوتابی یەکەمیەوە تۆپەکانیان بە نێوان قاچیان بەسەر هێلەکاندا بەرەو دواوەخلۆر دەکەنەوە وخلۆر کردنەوەی دووبارە بۆ پێشەوە لە ئەنجامدا ئەو ریزەی زووتروبێ هەلە کردن تۆپەکەیان خلۆر بکەنەوە لە هەردوو جارەکەدا خالێکیان بۆ (تۆمار)دەکرێت و لە کۆتایی یارییەکەدا کام ریزیان خالی زۆر تر بۆ نوسرابو ئەوەیان یەکەمە.......

<u>تێبینی/</u> ـ بەم شێوەیەش ئەم یارییە دەکرێت تۆپەکە کە گەیشتە قوتابی دوای ریزەکان پاش خلۆر کردنەوەیان قوتابی دوایی لە هەر ریزێك هەلی دەگرێت وبەلای چەپی ریزەکانیاندا بەراکردن دێنەوە بەردەمی قوتابی یەکەم رادەوەستن وتۆپەکە بە ناوقاچی هاورێکانیاندا خلۆر دەکەنەوەهەروەها کام ریزیان هەموو ئەندامەکانیان بە تەواوی وخێرایی و بێ هەلە کردن تەواویان کرد ، ئەوریزەیان یەکەمی وەردەگرێت .

## (١٤) (( یاری برایەتی ))

(بۆ وەرزی بەهارو پاییز)

ژمارەی قوتابیەکان ١٦ تا ٤٨ دەبن

قوتابیەکان بەدووبەشی یەکسانەوە لەسەر دوو هێڵی بازنەیی دابەش دەکرێن بازنەیەک لە دەرەوە و یەک لە ناوەراستدا ڕادەوەستن بە هەرجێک هەر قوتابیەکی هێڵی بازنەی دەرەوە ببێتە هاوڕێ بۆ قوتابی بەرامبەری لە هێڵی بازنەی ناوەراستیدا لێرەدا یاری دەست پێ دەکات و مامۆستا بە قوتابیەکان ڕادەگەیەنێت کە بە پێچەوانەوەی یەکتر لەسەر هەدوو هێلەکەیان سوربخۆن پاشان دەیان وەستێنێت لەوەستاندا دەبێت هاورێکان یەکتر بدۆزنەوە ودەستیان بخەنە ناودەستی یەکتری ولە جێگای خۆیان دانیشن ئەو قوتابیەی لەهاورێکانی تری دوابکەوێت هەردووکیان دەکرێنە دەرەوە هەروەها ئەم یارییە ماوەیەکی دیاریکراو دەکرێت ولە کۆتاییدا ئەو دوو قوتابیەی تاکو دوای دەمێنێتەوە دەبن بەیەکەمی یارییەکەو بەخشیش وەردەگرن......



## (١٥) ((یاری زنجیرەی ڕاوکەر))

(بۆ وەرزی زستانە)

ژمارەی قوتابییەکان ١٠تا٣٠

قوتابییەکان بە ئارەزووی خۆیان لە یاریگا بلاودەبنەوە مامۆستا بەیەکێکیان دەلێت کە ڕابکات بە شوێنیانا ودەستیان لێبدات لێرەوە یارییەکە دەست پێ دەکات قوتابییەکە لە کاتێکدا کە بە شوێن هاورێیەکانیا ڕادەکات دەستی بەر هەرکامێکیان بکەوێت دەستی دەگرێت لەگەڵ خۆیدا ڕای دەکێشێت ئەو دووانەش ڕادەکەن وهەول دەدەن دەست بدەن لە سێیەم هەروەها دەستی ئەویش لەگەڵ خۆیان دەگرن تاوەکو وای لێدێت کە هەموویان دەست بەیەکەوە دەگرن و وەکو زنجیرەیەکی ڕاوی درێژی گەورەی لێ دێت کە قوتابییەکانی تری پێ ڕاودەکەن (دەگرن) ئەو قوتابیەی لە کۆتایی دادەمێنێتەوە وناگیرێت یەکەمین وەردەگرێت.



## (١٦) ((یاری گورگ ومەڕ))

(بۆ وەرزی بەهارو پاییزە )

ژمارەی قوتابیان ١١ تا ؛

قوتابیەكان لە وێنەی بازنەییدا ڕادەوەستن ودەستی یەكتری دەگرن، مامۆستا قوتابیەك لێ هەڵ دەبژێرێت كە ببێتە گورگ ویەكێكی تریان ببێت بە (مەڕ) مەڕەكە لە ناوەڕاستیانا لە ناو بازنەكەدا ڕادەوەستێت گورگەكەش لە دەرەوە رادەوەستێت ، لێرەدا یاری دەست پێ دەكات گورگەكە هەوڵ دەدات لە نێوان قوتابیەكانەوە بێتە ناوەوە ناو بازنەكەدا مەڕەكە بگرێت وبیخوات بەلاّم قوتابیەكان نایەلن هەروەهاش مەڕەكە خۆی لە گورگەكە دەشارێتەوە، یارییەكە ماوەیەك درێژە دەكێشێت لە ئەنجامدا ئەگەر گورگەكە توانی بچێتە ناوەوەو مەڕەكە بگرێت بەسەر كەوتوو دەژمێردرێت. مەبەست وهیوَا لەم یارییەدا یەكیەتی و یارمەتی دانە لە نێوان قوتابیەكاندا.



## (١٧) ((یاری زەوی ودەریا))

(وەرزی بەهارو پایزە )

ژمارە قوتابیان ١٦تا ٣٠ دەبێت

مامۆستا چەند بازنەیەك نەخشە دەكات كە نیوە (تیرەكە)یان (٢) پێ بێت وقوتابیـەكان دەكـات بەدووبەشـی یەكسـانەوەو هێڵـە بازنەییـەكان دەبێت ماوەیـان لـە (٣) پێ لـە یـەكتر دوور بێت قوتابیـەكان لـە دەرەوەی هێڵـە بازنـەییـەكان دوودوو بەرامبـەر بـەیـەك رادەوەسـتن، دەرەوەی هێڵـە بازنەكان ناو دەنێن(زەوی) ناوەوەیان ناودەنێن (دەریا) لێرەدا یاری دەست پێ دەكات كاتێك مامۆستا ووتی (دەریا) قوتابیەكان بـە هـەل بـەزین ویـان بێهەل بەزین دەچنە ناو بازنەكانەوەو ئەگەر ووتـی (زەوی) دێنـە دەرەوە وهـەروەها ئەگـەر ووتـی (زەوی و دەریـا) قاچكێـان دەخەنـە نـاو بازنەكـەو قاچەكـەی تریـان لـە دەرەوە دەمێنێت هەربـەم شـێوەیە یـاری ماوەیـەك دەڕوات ئەوانـەی هەلـەی تێدا بكـەن لـە یارییەكـە دەكرێنـە دەرەوەوكـام قوتابی یان كام كۆمـەل بێت تـاكو ئـەوەی دوایـی مایـەوە ئـەوەیان دەبێت بەیەكەم.



## (١٨) (( یاری ڕاوی مشك وپشیلە))

(بۆ وەرزی بەهارو پایزە )

ژمارەی قوتابیان ١٥تا ٤٠

هێڵێکی بە درێژی (٢٠) یارد لەسەر زەوی نەخش دەکرێت ناودەنرێت بە (هێڵی پاراستن) بە دوری (١٢) یارد لەم هێڵە کورسی یان مێز یان پەیژەیەك لە ناو یاریگا دادەنرێت و ناو دەنرێت جێگای خۆشاردنەوە لێرەدا یارییەکە دەست پێ دەکات قوتابیەکان لەسەر هێڵەکە رادەوەستن بەڵام یەکێکیان دەکرێت بە پشیلە لەسەر کورسیەکە ویان لە پشت کورسیەکەخۆی دەشارێتەولە کاتێکدا مامۆستا بە قوتابیەکانی سەر هێڵەکە رادەگەیەنێت کە لاسایی مشك دەکەنەوە کە بڕون بۆ پێشەوە نزیك پشیلەکە بکەونەوە بەدزە دزە لەکاتێکدا لیٚ نزیك دەبنەوە پشیلەکە پەلاماریان دەدات کە ڕاویان بکات وبیان گرێت، مشکەکانیش لە ترساندا دەگەڕێنەوە بەڕاکردن (بۆ هێڵی پاراستن )ە کەی خۆیان ئەوقوتابیەی پێش گەیشتنی بە هێڵەکە لە لایەن پشیلەکەوە گیرا جێگای یەکتری دەگۆڕنەوە ئینجا ئەمیان دەبێتە پشیلە یارییەکە ماوەیەك درێژەی پیٚ دەدرێت پاشان کۆتایی دێت.



## (١٩) ((یاری جالجالۆکە ومێش))

(بۆ وەرزی بەهار وپایزە )

ژمارەی قوتابیەکان ١٦تا ٤٠

قوتابیەکان یەك لە پشت یەکەوە لە وێنەی بازنەدا ڕادەوەستن ئەمانە لاسایی (مێش) دەکەنەوە یەکێکیانیش لە ناوەراستی بازنەکە ڕادەوەستێت لاسایی جالجالۆکە دەکاتەوە وردە وردە لە مێشەکان خۆی نزیك دەکاتەوە وهەول دەدات لە پر یەکێکیان بگرێت کەمێشەکان پێیان زانی هەل دەفرن و ڕادەکەن بۆ جێگایەکی تایبەتی کە مامۆستا بۆی داناوە پێی دەلێن (جێگای رزگاربوون) کە گەیشتنە ئەو جێگایە بۆ جالجالۆکەکە نیە ئیتر دەستیان لێ بدات و ڕاویان بکات بەلام ئەو قوتابیەی دەستی لێ دەدرێت ودەگیرێت ئینجا ئەویان دەبێت بە جالجالۆکە وهەروەها ئەم یارییە چەند جارێکی تر دووبارە دەکرێتەوە پاشان کۆتایی پێ دەهێنرێت.



## (٢٠) (( یاری لێدان بە تۆپ ))

(بۆ وەرزی بەهارە)

ژمارەی قوتابیان ٢٠ تا ٤٠

مامۆستا قوتابیەکانی دەکات بەدوو تیپی یەکسانەوە بەشی یەکەمیان سێلێکی بازنەیی پێك دەهێنن و تۆپێك دەدرێتە دەست یەکێکیان بەڵام تیپی دووەمیان لە ناوەڕاستیانا ڕادەوەستن لێرەدا یاری دەست پێ دەکات لە کاتێکدا مامۆستا ئیشارەت دەدات ئەو تیپەی تۆپەکەیان پێیە دەیگرنە تیپی ناوەڕاست لە پشتینەکەیانەو بۆ قاچیان ئەوانەی تۆپەکەیان بەردەکەوێت لەیارییەکە دەکرێنە دەرەوە ولە جێگایەکی تایبەتی دادەنیشن هەروەها ئەم یارییە درێژە دەکێشێت تاوەکو لە ئەنجامدا تەنها یەکێکیان دەمێنێتەوە ئەوەیان یەکەمی وەردەگرێت وبەخشیشی دەدرێتێ.



تێبینی :-

١ـ ئەو تیپەی کە تۆپەکە هەل دەدەن دەتوانن بۆ یەکتری بهاوێژن( پاس) بدەن بە یەکتری بۆ ئەوەی سەرلەوانە بشێوێنن کە ڕاوەستاون لە ناوەڕاستی بازنەکەدا.

٢ـ زۆر یاری بچووکی میللی منداڵان هەیە مامۆستای بەرێز دەتوانێت بە گۆڕین ویان بەلێ زیاد کردن وکەم کردن لە قوتابیەکانی وبیکات بە پەروەردەی وەرزشیدا بەپێی توانایان وبەپێی وەرزەکان، لە ژینگەی دەوروبەر (بیئە ومحیط) یان بۆ ژیانەوەی یارییەکە کۆنە-مێژووی یەکانمان، لێرەدا مامۆستا دەتوانێت سود وەربگرێت لە (پەرتووکە فۆلکۆری یە یارییە کۆنەکانی کوردەواری).

٣- هەندێك جولانەوەو هەل بەزو دابەز. ویاری گشتی لە پلەو قۆناغی یەکەمدا بۆ پۆلەکانیبەراییو بۆ قوناغی ساوایانیش ئەم مەشقانەی لای خوارەوەش دەدرێت بۆ ووریا بوونەوەی گشتی.

**١- مەشق کردن لەسەر رۆیشتن بە لاسایی کردنەوە:**

أ - رۆیشتن بەسەربەستی

ب - رۆیشتن لەجێگای خۆت

ج - رۆیشتن بە هێواشی .

د - رۆیشتن بە خێرایی .

و - رۆیشتن وەکو حوشتر.

خ - رۆیشتن وەکو کەلە شێر وورچ.

ع - رۆیشتن لەسەر قاچێك(هەنگە شەلە)

ر ـ رۆیشتن بۆ هەر کوێیەك.

ز ـ رۆیشتن بۆ ماوەیەك .

س ـ رۆیشتن وەکو کەروێشك.

ه ـ رۆیشتن وەکو ئاسك.

ص ـ رۆیشتن وەکو لەقەلق وقەل

ی ـ رۆیشتن وەکو مراوی ـ بۆق

غ ـ رۆیشتن وەکو مەیمون

## ٢- مەشقی لە جێگای خۆت ( مراوحە )

أ - بەڕاوەستان

ب - لەسەر یەك قاچ (هەنگە شەلە)

ج - خێرا و هێواش

د - بەوەرگەڕانەوە

و - لەگەڵ ڕۆیشتن

## ٣- مەشق کردن لەسەر ڕاکردن

أ - لە جێگای خۆت ڕاکردن.

ب - لەسەرخۆ ڕاکردن وەکو حوشترو فیل.

ج - خێرا، ڕاکردن وەکو شێر، پلنگ ومشك.

د -ڕاکردن بۆکوێ دەتەوێت.

و - ڕاکردن بە شوێن تۆپدا .

ه - ڕاکردن وەکو(کەروێشك ـ مشك ـ پشیلە ـ مراوی ـ ئاسك ـ کەلەشێر ـ غاردانی ئەسپ ـ مەیمون ـ باز ـ ڕێوی ـ چەقەل ـ چۆلەکە .........هتد) .

## ٤- مەشقی هەڵ بەزین بە مۆسیقا( الایقاعیە ) کاتدار: -

أ - هەڵبەزینی هێواشی لەسەرخۆ لە سەر زەوی و بە هاوسەنگی .

ب - هەڵبەزینی بەرز لەسەرخۆ لِە سەر زەویو بە هاوسەنگی.

ج - هەڵبەزینی بەرزتر لەسەرخۆ لە سەر زەوی و بە هاوسەنگی.

د - هەڵبەزین لە جێگای خۆت لەگەڵ دەستەکان بۆ سەر (سەر) بۆسەر (شان - پێشەو- سەرەوە - تەنیشت).

و - هەڵبەزین بە کردنەوەی هەر دوو باسك وهەردووقاچ.

ه - هەڵبەزین لەگەڵ دەست بۆ کەمەرو کردنەوەی هەردوو قاچ.

ر - هەلبەزین لە جێگای خۆت پاشان رۆیشتن پاشان لە جیٚی خۆت.

ز - هەلبەزین وەکو کەروێشك ـ پشیلە ـ بۆق ـ مشك ـ تۆپ .

ن - هەلبەزین بەسەر ئەژنۆ ـ بەرد، چال ....هتد.

**ه - هەندێك نموونەی وەرزش كردن لە ژوری پۆلدا بە تايبەتی لە زستاندا:**

١-ووریابوون بە لێدانی هەردوو لەپی دەست لە تەختەی دانیشتن.

٢- پشوو دان بە نوشتانەوەی هەردوو قۆل بۆ سنگ .

٣ – هەلسن، هەلسان لەسەر تەختەکە.

٤ – دانیشتن، دانیشتن لەسەر، تەختەکە.

٥ - بنون، سەر دەخەنە سەر تەختەکان و دەنون .

٦ - لەخەو هەلسن، سەر هەل دەبرن بۆ سەرەوە.

٧ - بنـون، دووبـارە لـەم کاتـەدا مامۆسـتا پیٚـیان دەلێـت کـە هـەندیك پرسیاریان لیٚ دەکات تا وەلام بدەنەوەو وەکو(کیٚ زیرەکـە.! کیٚ ژیـرە ! کیٚ راست گۆیە ؟ کیٚ وریایە ؟ .....هتد) یان (کیٚ نان دەخوات؟ کیٚ هـەنگوین دەخوات؟ کیٚ زەهر دەخوات؟ کیٚ ئازایە؟ کیٚ گەوجە؟.......... هتد.

ئەوانەی لەوەلامدانەوەدا هەلە دەکەن سزایان بۆ دادەنرێت.

٨ - کردنی (یاری )(بوم) مامۆستا ناوی قوتابیەکان بە ژمارە ناودەنێت لـە (١ تـا ٤٥) ئەگـەر قوتابیـەکان ژمارەکـەیان ئـەوەندە بـوو، مامۆسـتا داوای ژمـاردن دەکـات لـە قوتابیـەکان لـە ژمـارە (١)وە، داوای لیٚ دەکـات ئەوانـەی ژمـارە (٥)ن ویـان چـەند ئـەوەندەی (٥) بـن لـە جیـاتی ژمارەکـەی خۆیـان بلێن (بوم) لە ئەنجامدا ئەوانەی هەلە بکەن تیٚ دەکەون وسزا دەدرێن .

٩ - یاری کردنی ـ (گەنم گەنم) بەژمارە.

١٠- یاری (پشیله رۆیشت، لەسەر ڕانم، ویستم بتگرم کلاوەکەی فڕاندم) بە ئیشارەتەوماموّستا بوّیان دەکات ئەوانەی هەلە دەکەن لە ریز دەر دەکرێن.

١١ - یاری کردنی( فری فری چۆلەکە فری)

١٢- یاری (هاورێکەت بناسە)

١٣- ئەنجام دانی چەند مەشق وجولانێك بۆ خۆگەرم کردنەوە وریا بونەوە وەکو (ناودەست لەیەك خستن، لێدانی ڕانەکان). هەردوو پاژنەکان لە دوای یەك بەزەوی دا دان.

١٤- فێرکردنی سرود وگۆرانی (میللی) و تایبەت بەقوتابخانە.

١٥- چیرۆکی لاسایی کردنەوەی وەرزشی بچووك.

١٦- (مەتەل) هەل هێنان وقسەی نەستەق.

١٧- گرەو کردنی هەندێك یاری بەپەراو وپێنوس وراستەو دەباشیر ....هتد کەمەشق بن بۆ وانەکانی ژمارە وزانیاریو مێژوو جوگرافیا .....هتد . (بەم یارییانە دەلێن یاری (یاری چەند) (لعبە کم).

وە لەکۆتایی داوا لەهەر قوتابیەك دەکریّ بۆ نووسینی (٣٠) یاری بچووك لەگەلّ وێنەو هەموو داواکاریەکانی یاری. (تکلیف کل طالب بکتابە (٣٠) لعبە صغیرة)

## ((سەرچاوەکان))

الألعاب الصغيرة / تأليف السيد / كامل عبدالمنعم
والسيد / وديع ياسين محمد

مؤسسة دار الكتب للطباعة والنشر / ١٩٨١

